# لەژێر شەپۆلەکانی خۆردا

هۆنراوەی

سەرهەنگ حەمە ساڵح

خامۆش

کتێب :    لەژێر شەپۆلەکانی خۆردا

نووسەر : سەرهەنگ حەمە ساڵح (خامۆش)

بابەت :    هۆنراوە

تیراژ :    ١٠٠٠ دانە

مۆنتێڤ هونەرمەند: سۆران ئیسماعیل

تایپ و نەخشەسازی و بەرگ : (هیوا) بۆ کۆمپیوتەر

چاپ : چاپخانەی (          )

چاپی یەکەم – هەولێر / ٢٠٠٦

ژمارەی سپاردن (    ) ی ساڵی ٢٠٠٦ ی دراوەتێ

# پێشەکی

ئەم کۆپلە ووشانە کەلە دەروونێکی ناسك هەڵدەقوڵێ بێگومان چەند پەڕەکاغەزێك دەڕازێنێتەوە هەندێ جار لەگەڵ سۆزو میهرو جوانیەکەی خۆیان دەخزێننە نێو چوار چێوەیەكو دەبنە نامیلکەیەکی خنجیلە.. ئێمە وەکو سەندیکای خاوەن پیشە تەندروستیەکان پیرۆزبایی لەشاعیر دەکەین هیوای سەرکەوتوویی بۆ دەخوازین دیارە زۆربەی کارمەندی تەندورستی بێجگە لەبواری کارکەی خۆی لەزۆربەی گۆشە جیاکانی حەزو ئارەزووەکانیان بەهرەدارن. . .

ئەوەتا ئەم شاعیرە شیعرەکانی هەموو سیفەتەکانی رەسەنایەتی شیعری پێوە دیارەو بەپەیڤە جوانەکانی دەبێتە میوانی شۆمای چاومان ئێمە وەکو سەندیکا خزمەتی ئەم هەستە بەسۆزەی دەکەینو شیعرەکانی بەپێڵوی چاوی شیعر دۆستان شاد دەکەین لەکۆتایی هیوادارم سەرکەوتوبێت.

**کەمال هەریری**

**نەقیبی سەندیکای**

**خاوەن پیشە تەندروستییەکان- هەولێر**

# گریانێک بۆ دۆسیەی عەشق

ماوەیەکە
گریان بۆتە
ژەمی تینوی
ساتە پڕ بیرەرەوەرییەکانم...
سیمات لەنێو
ڕۆندکە قەتیس ماوەکان
دەبینم...
دێیت وەکو زەنگیانە
یاری بە پەیڤە بێ ئارامەکانم
دەکەیت..
مشتێ ماچی
کیشوەری خۆرم
بۆ دێنێ...!
ڕاز دەبێتە
میوانی باوەشمان...!
لەژێر لێزمەی
بارانێکی ئەفسوناوی
سەما بۆ هیواکانمان

دەکەین..

هێدی .. . هێدی

بە پەنجە زەردو سیسەکانم

پرچە خاوەکانت

شانە دەکەم...

وەرە گوڵم

زەمانێکە ڕووخسارت

ئاوێتەی گۆشەی

تامەزرۆم نەکردووە

ئاخۆ ئێستا

تۆش وەکو من

بۆ دۆسیەی تەمەنی

ئەم عەشقە... گریاوی..؟

# پاکیزەی تۆ...!

قەرار بوو
سەفەرێک بۆ
کیشوەری شەرم بکەین
ماڵ ئاوایی
لەکازیوە بکەین..
بە سۆمای چاو
لە نهێنیەکانی شەوەزەنگ
بدوێین..
سەرخەوێک لە ژێر پەردەی
ساتە ناسکەکان
بشکێنین..
تینوێتیم بەماچە
ئەرخەوانیەکان
بشکێنم..!
پەیکەرێک
بۆ ئازاری گوناهەکانمان
بتاشین...
لەم شەوەدا

**تا بەیانی**

**رۆحم بەبەزەیی**

**پاکیزەیی تۆ بسپێرم..**

**تا ئەو ساتەی**

**لەگەڵ جریوەی**

**کەناریەکانی سەرسینگت**

**وەئاگادێم..!**

# قەرەچوغ بوکی بەهارە..!

لە پێدەشتی
شەوە نامۆکاندا
چرکەی هەستێکی بە حەسرەت
دەڕژێتە نێو
زوورگەکانی ئارەزووی هەست
لەکازیوەی
ئەفسوونی ئەندێشە جوانەکان
قەرەچوغ بوکی بەهارە..!
لەم دیوی تابلۆ جوانەکەی بازاڕگە
لەدەشتەکاکی بەکاکییەکەی من
مەخمور چەندە شیرینە..!
لەم دەڤەرە
دەست نوێژێ بەئاوە سازگارەکەی
ئاوی بن بەرد هەڵدەگرم
نوێژی ئەوین
لەسەرقەلا دەکەم..
گڵپەی هەنسکی منداڵیمە
لەکوچەو کولانەکانی ئەم شارە

دەرژێتە نێو
هەگبەی خەیاڵی لاویەتیم..
ساباتە جوانەکانی قەسران
سەر لەنوێ
لەگەڵ شەپۆلە هێمنەکانی دەرمانئاوادا
بەرووی شارا پێدەکەنن..!
کورە دلێرانی شار
سروودی سەربەستی دەچڕن
کچانی باڵا بەرزی قەراجیش
تارای بوکێنی
بۆقەرەچوغی بوکی بەهار
دەچنن..!

# کە گریان ماچی خاک دەکا..!

ڕووت بێنە لام
زویر مەبە
وا بروسکی هەورێکی ڕەش
بەسەر ڕۆحی ئەبەدیما
شریخەی دێ..
لێم ببورە .. کەناتوانم
لە ژێر لێزمەی
ئەم بارانە بەلێشاوە
قژی خەمەکان.. دابێنم..
ئەمشەو
ئەستێرەکانی ئاسمانی
ئەم غوربەتە ئەفسوناویە
بە سیمای ئازارەکان
پێناکەنن...
لە پەنجەرەی
حەزە تینوەکاندا
پەنا بۆ شەپۆلە
بێ ئارامەکانی دەریا دەبەم..

ماچی ئەوین
لە گەردنی ئازارەکان
گرێ دەدەم..
دەستی ژیان دەگرم‌و
بەنێو لەپی
ساردی مردنی شاد دەکەم..
وەرە گوڵم
زویر مەبە
ئەم سەفەرە کە ناتوانم
دەست لە ملی خەمەکان کەم
تاگریان ماچی خاك بکا
تاخوێنیش لە لێودا بتکێ...!

# ئاوێتە بوونی ڕۆح

زریان
دەستت خستە
نێو دەستی ڕەشەباو
گەڵای زەردی چاوەڕوانی
عومرێکی کورتت هەڵوەراند
چۆن دڵت هات
شای نێوگوڵانی باخچەی شاری کیشوەری با
لە ئامێزی ئەوینستانی
رۆحێکی بێ ناز
جێ ئافات کەی..
من بەتەنیا
لە نێو دارستانی
وەهمێکی ئەبەدی
بەکوڵ دەگریم..
لە ژێر ساباتی
ورشەی دارەکاندا
دەسرازەی خەم
دەهەژێنم..
پڕ بەحسرەت
گەڵا زەردەکانی
ماچ دەکەم..

بێ بەش دەبم
لە دیمەنە ڕۆمانسیەکانی
جووت بووندا
خەیاڵ بەرەو
شەپۆلە بێ کۆتای یەکانی
دەریام دەبا..
لەوێ وەکو جاران
لەکەناری
لافاوی عەشقەوە
پرچە خاوەکانت
دەکەیتە ڕەشماڵی
ڕەنگی زەردی
پڕ تامەزرۆم..
لە کەرنەڤاڵی ئەم ساتە
چ عەشقێکە.
سوپرانۆی زەماوەندی
ئەم شاعیرە شێتە؟!
باوەش دەبێتە
جێ ژوانو...
تا ئەو ساتەی
هەردوو ڕۆحی
ئاسودەی یەک
ئاوێتەی یەکتری دەبن!

# کۆچێکی نامۆ

(بۆ ئەو شۆخەی کە تەمەنی ژیانی کورت بوو)

زەنگی .. چ کۆچێك بوو
لەکڵێسەکانی هەندەران
سیمای چ ئەستێرەیەك بوو
لەئاسمانی غوربەتی شار
ڕژایە نێو
شۆستەکانی غەریبی..
ئەم سەفەرە
باڵندە بێ فیزەکانی
ئاسمانی خەمی شارەکەم
کۆچ بارانی چ بوکێکیان
بۆ ترانزێتی دڵی زاوایانی
نوستو هێنا..
فرمێسکە قەتیس ماوەکان
بێ سەردولکەی
دایکێکی هەڵوێست شەرقیانە
نارژێنە سەر
گۆنای زەردی

ئەم دەڤەرە پڕنامۆیە..
هێشتا زوو بوو
پەپوولەی ئارەزووی هەستت
نەگەڕابۆوە.
ئاسمانی حەزی شارەکەت ..
چاوەڕوان بووم
لە سنووری حەزەکانی
دەروازەی هەڵوێستێکی
پڕ سۆز..
بە دیدارت شادبم..
کەچی کەژاوەی مەرگت
گەڕایەوە..!

# دەروازەی خەوە ئەرخەوانییەکان

لەگەڵ شەپۆلی عەشقت
هاوتا دەبم
بۆ دەربەندی
تەمە سپیەکانی ڕۆح
دەستەکانم
دەکەمە سەرینی
سیمای پڕ ژاکاوی تۆ
بەبارانی وەرزی کۆچی
سەفەرێکی پڕ شەپۆلیٚ
بیٚ ناونیشان دەبین
ئەوکات
ئەمن بادەی
شیعرە تینوەکان
دەخۆمەوە...
ئەتۆش هەگبەی ووشەکانم
بەتاڵ دەکەیت
دەروازەی
خەوە ئەرخەوانیەکان

لە تارمایی چاوانماندا

وون دەبێـتو

لە تراژیدیای باوەشماندا

دەتوێتەوە..

نوێژی مردوو

لە سەر خەمە سەربڕاوەکان

دەکەین..

گۆرانی عەشق

بۆ قوربانیەکانی ئەم جەژنە

دەچڕین...!

# ملوانکە

کە هاتمە لات
لەوێ نەبووی
هەگبەی چەند ساڵەی تەنیاییم
بۆت هەڵرێژم
لە درزی پەنجەرەکەوە
سەیرم کرد
ژوورەکەت بەبێ چرابوو
بە تاسەوە لەبەر دەرگا
بۆم جێ هێشتی
کە هاتیەوە.. بەهێمنی
بەبێ چرپە.. بگەڕێوە
تا دێمەوە
با حەزە ئەرخەوانی یەکانم
وەئاگا نێن
بەئەمانەت لەکەشکۆڵی
دڵت داینێ...
لەوێ نەبووی
زامی سەختی
ئازارەکانی ئەم شەوە
بەپاکیزەیی تۆ
سارێژکەم..

پەیامی ئەو خەونەی
کە دیبووم
بە ئامێزی ڕۆحتا شادکەم..!
کە هاتیەوە.. بە هێمنی
بەبێ چرپە.. بگەڕێوە
تادێمەوە
باحەزە ئەرخەوانی یەکانم
وەئاگانێن
لەوێ نەبووی
تا گوناهی
خەندەپڕ بەرائەتەکانت
بە فرمێسکی چاوەکانم
بشۆمەوە..
ئەو قەسیدەی بۆم دانابووی
وشەکانیت بۆ سەربڕم
بیکەمە قوربانی ئەم ساتە پیرۆزە
کە هاتیەوە.. بە هێمنی
بەبێ چرپە.. بگەڕێوە
باحەزە ئەرخەوانی یەکانم
وەئاگا نێن
تادێمەوە ..
دەیکمە ملوانکەیەکءو
لەگەردنت دەئالێنم..!

# هەگبەی تەمەن

تەمەن کورتە
کێ لەزامی
سەختی برینی من
تێدەگا..
ڕەوڕەوەی
عەشقێکی پیرۆز
لەدوا فارغۆنی ماڵئاوایی
سەری ناوە..
هێدی .. هێدی
بەجێ ی هێشتم
سیمات لەنێو
فرمێسکە قەتیس ماوەکان
جێ هێشت...
هۆ کچەکە..
ئەی جوانترین
تابلۆی کازیوەی خەیاڵم
خۆ تۆ خەندەت
سوپرانۆی

تەرمی شیوەنی
شاعیرێکی شێتە
بگەڕێوە..!
گوێت لەناڵەی
قورِگی نووساوم نی یە؟
پێت وانی یە
ڕۆژێ دادێ
لەجوانترین گۆشەی حەزم
دەتکەمە هەوێنی
شیعرێکی تازە ..؟
تێکەڵ لێوی قڵیشاوی
ووشە تینوەکانم دەبی..
وەرە مەڕۆ
ئەم زریانەی لەڕێگاتە لافاوەکەی.. گەلێ تووشە
زۆر دەترسم
ئەمجارەیان..
سەرگەردان بی...
بەرەو نامۆ
بەرەو ووڵاتی کەس نەناس
وون بوونێکی
بێ دەنگ‌و باس..!

# لەئامێزی خەزان دا

ژوانێک لەساتە وەخت دا..
تێکەڵ بوونی
هەناسە گەرمەکانی
چاوەڕوان کراوی
هەگبەی ئارامی..
لە بیر چوونەوەی هەستە
پڕ دۆڕاوەکانی
تەمەنە..
ئاواتە پڕ ئەسرینەکانی
نێو هەگبەی
ساتە بەفرینەکان
گڵکۆی عەشقێک
لەگەرمەسێری .. تاوانەکانی
ئامێزی خەمێک
دەسووتێنن..!
لە ژێر پێخەفی
ئەم تەمەنە پڕحەسرەتە
وشەی پایزە شێتەی

ناوەخت
پرچی خەزان
لە قەدی حەزەکانی
ئەم شەوە.. دەئاڵێنێ..
دوو هەناسە
دوو جەستەی سڕ
پێکی ئەوین
لە ئامێزی یەکتریدا
دەخۆنەوە...!

# قەدەری من و...

ئەی سۆز
ئەمشەو بەمژدەکەت
سەرگەردان بووم..
ماچی خۆرو گڵکۆی شیعرێک
بانگیان کردم..!
پیتەکانیم یەکە. . یەکە
لە بەرۆکی کچێک چنی..
ویستم بیکەمە ملوانکەیەك‌و
لەگەردنی بئاڵێنم..!
لەپانتایی زوورگەکانی
ئارەزووی هەست
چیایەك لێم هاتە وەڵام
ووتی ئەی من..
لە پێدەشتی
ئەم شەوە نامۆیەدا
گرێک وتی
ئەی من..
تا دەهات

سەرگەردان تر دەبووم

بۆنی گوڵێک..

سۆزی گڕێک..

سیمای باڵای .. چیایەک

کامیان بکەمە

تارای سووری.. بوکی ئەوین..

لەم شەوە نامۆیەدا

ناچار خزامە

نێو ئەرشیفی

دۆسیەی مێژوو

خۆمم دەخیلی

قەدەر کرد..

لەتەک هەڵۆیەکی ... نێژرام!

# دادگای عەشق..

ئەمشەو
جەستەی مات‌و سڕم
لەبەردەمی دادگای عەشق
ئاوێزانی هەگبەی .. پەیڤی
یاخی بوونە..
کوڵمی ئاڵت
گەواهی تاوانم
بۆ دەدەن..
سینەت بۆتە
دادوەری حەق
ئارەقەی شەرمیان
لێوە دەتکێ..!
لەنێو تاڵە بەندی
قژی خاوت
بۆ بیرەوەریەکانم
دەگریم..
سۆمای چاوم
بڕیوەتە چەکوشەکەی
پێڵوی چاوت .. هۆگوڵەخان
ئازادم کە.. ئازادم کە..!



## شاباش..

لێکدابڕان
خەونی دووری
عاشقانی
نیشتیمان‌و کەزی جوانی
نازدارەکەی.. دڵدارانم
چەند ئەستەمە
لە بێ ئارامی تەنیایی
خەونی دووری
شاعیرێکی نامۆی
بێ ناونیشان
زاڵم..ئەی بێ وەفا
هێشتا کفنی
پەیمانەکەی نێوانمان
زەرد نەبوو بوو..
چۆن دڵت هات
قژی خاوت بکەیتە
ڕەشماڵی ڕێبوارێکی
بێ هەست و سۆز

سیەکانت
بۆ هەناسەیەك والآکەی
کە هەرگیز لەبۆنی گوڵ
ناگات..
هۆ بوکەخان
لەم ڕۆژەدا
لەبەردەم ئارایشگای
جوانی تۆ
دەبمە قوربانی
ئەوساتەی
پەنجەکانت
بەنێو لەپێکی تر
شاد دەکەیت..
من دەزانم .. لەم ئێوارەیە
لە زماوەندی .. بوکێنیت
سۆزی ئەم عەشقەی نێوانمان
شاباش دەکرێ..!

# من و ڕۆژگاری شالاو..!

(پێشکەشە بەشالاوی شاعیر)

بەر لەوەی یەکتر بناسین
سۆزی ڕۆندەکانی ڕۆژگار
هێدی.. هێدی
بە شەرمەوە
بەسەر پلیکانی دڵم
فەرشی نائومێدیان دەچنی
وای لێکردم
فاڵێک بۆ بەخت بگرمەوە
پەیکەرێک بۆ ساتەکانی تەمەن
دروست بکەم..
مینبەرێک بۆ سۆزی عەشق و
مۆمێک بۆ شەوانی
ئەنگوستەچاوی تەنیایی
داگیرسێنم..!
لەگەڵ خەیاڵ
تەبا دەبووم
بەرەو سەرابستانی

واقیعێکی بێ سنوور

من پێکم لەبڕگەکانی

شیعر هەڵدەدا..

سۆزی دەنگیش

یادگاری یەکی لەئەندێشەم

تۆمار دەکرد..

لەسەر شانۆی خەیاڵم دا

حیوارێکی پڕ لە ئەوین

دروست دەبوو..

من لەگەڵ ڕۆژگاری زاڵم

حەزیش ئەشکی

لێ دەچۆڕا..

لەکۆتایی

کەس چارەی دەردی دڵی نەزانیم.!

من بەگریان..

ڕۆژگاری بەختیش

تا دەهات

ڕووی شالآوی

گەشتر دەکرد..!

# چیم لە مەملەکەتی خۆرداوە..!



خۆر بەشەرمەوە
ئاوێزانی پڕ شەنگی
سیما وێرانەکەت دەبێ..
چەند ئەستەمە
ئەم زریانەی
سەدان پەرچەمی دارەکانی
ئەم دارستانەی هەڵوەراند..
چیتر درۆ لەگەڵ خۆم ناکەم
بەتریسکەی مانشێتەکان
هەڵناخەڵەتێم..
من بۆ تۆقەی
پرچی کچانی ئەم شارە دەگریم..!
دوو بەیانی
لەچەکی خەمێک
دایاندەپۆشێ..
ناسنامەیەک نی یە
بەشەنگی ئەم خاکەوە.. بنارێ
بۆ شەپۆلی خوێن .. بۆنی سیانید

شاڵاوی ئەنفال.. بگری..
وەرە خانم
بە شەرمەزاریەوە
نێو چەوانی یەکتر ماچ کەین
واخەریکە خۆری ئەوین
جێمان دێڵێ..
با لە ئەلفەوە
دەست پێ بکەین
جاران
من نیشتیمانێکم خۆشدەویست
لەئامێزی خەزان وەریو.. ئاڵا بوو
ئەمڕۆ وەکو پەرەسێلکەیەکی
وەرز ئاسا .. سەرەتاتکێ
لەگەڵ بنمیچی کاریتەکانی
خەباتی چەند ساڵەم دەکا..!
چیم لە مەملەکەتی
خۆر داوە..
وا ئەستێرە.. پرچی گەشی
لە ئاسمانی کاسەی سەرم
شانە دەکا..!

لە شەوێکی ئەنگوستەچاودا
چاوەڕوانی تریفەی مانگم
بۆ چەند پەیڤێک لەگەڵیدا..
بۆ حیوارێک لەگەڵ ئەزەل
لیّ ناگەڕێن
بەئەستەمیّ.. لە باوەشی دایکم بنووم
تێر .. تێر بنووم
چیم لە مەملەکەتی خۆرداوە. .
چەند ئەستەمە
بەڕایەڵی ڕازی بوون و
دڵی خاکو .. ماچی گوڵی
دارستانی دێوەزەمەی
ئەم دەڤەرە .. ترسناکە
بەچاوی شەپۆلی دەریاوە. .
بەزەییت بەهیچ شتێک
نەیەتەوە..
شەماڵ چیت لە هۆزان و
نەغمەی ئاگرینی.. ئەم سەردەمە داوە
وەرە دەست لەملی
ئازارەکانی ئەم غوربەتە بکە. .

داستانی پڕ قارەمانی
بۆ کوڕانی ئەم دەڤەرە
بگێڕەوە. .
پێیان بڵێ.. لە گۆڕستانی شەهیدان
لەسەر تابلۆی.. کێڵەکانیان
فێر دەبن چۆن
دڵێ خاکو .. سۆزی دایک
لەباوەش کەن..
لەسەر مەزاری
گۆڕەکەی خورشیدیش
نێوچەوانی دڵدارەکانیان
ماچ کەن..!
چیم لە مەملەکەتی خۆرداوە
دێوەزمەو ..داوێن پیسی
ئەم دەڤەرە
ئاوی پاکی نیشتیمانیان
بێ نوێژ کردم..
ئەو سروودەی .. بۆ سەربەستی
دەمان چڕی..
کردیانە ملوانکەیەکو

لەیەخەی مێژوویان.. چنی..
نوشتە نەما
بۆ نووسانی سۆمای
چاومان.. نەیکەن..!
خەون.. نەما
لەشەو چەرەی
درۆ گەورەکانیان
بۆمندالأن.. نەگێڕنەوە..!
وەرە خانم
فریای هەگبەی
عەشقی یەکترکەوین..
با ئەمجارە
بە تەنیا .. لەرێی خێلأندا
نەمنێژن..
لە سەفەری دێوانە فێربووم
لەکازیوەی دەشت وکێودا
دەست لەملی خاتووشەم کەم
کەئەستێرە
تریسکەی خۆشەویستی دارڕشت
کە مانگ تریفەی بەڕووت پێکەنی

ئاسا وەکو کەناری حەز

ئاوازی خۆشەویستی بچڕین..

وەرە.. لەتارمایی خەیاڵ

دەرمبێنە..

لەگەڵ گزنگی بەیانا

دروشمی ئەویندار یمان

لەتەک ئاڵای سەربەخۆیی

هەڵکەین..!

لەجیاتی خۆری ئازادی

هەناسەمان.. تێکەڵ یەک کەین..!

# سەفەرێک بۆ دەریای عەشق

دەریا
بە قوڵایی
ئەم دووری یەی
بەناختەوە
دێنە خوارێ
بەم شەپۆلە شێتانەی
کە حەزەکان
بۆ ئاپۆری.. مەرگ دەبا
بێ کۆتایی..
منی سەرشێت
هەنگاوەکانم
مەست دەبن
بۆ کەناری ئەو دەریایەی
کەس ناناسێ..
دەست بۆ هەوکی
مەرگی هەموو کەسێ دەبا..
بۆ ساتێکیش
بە شەپۆلی حەسرەتەکان

سیمای یەكتر بشۆینەوە..

مەرگ دادی

ئەو سنوورەی

نێوان من‌و دەریا.. دەدا..!

ئەم سەفەرە

من‌و بوكی دەریا..

من و پرچی ئەو نازدارەی

لەشەپۆلی دەریا دەكا..

من‌و بەزەیی ...

كەناری ئەم دەریایەی

دەست بۆ هەوكی.. عەشق دەبا..!

# لە یادی پایزە ژوانێک

لەگەڵ وورشەی دارەکاندا
پێ دەنێمە ساڵیادی
پایزە خەزانێک..
بێ سوودە ئاوزینگی
فرمێسکە بێ نازەکانم
تازە ڕۆیشت..
چیدی ڕووی ناسکی گەڵاکان
بە ئاسۆی بەیانێکی تر
پێ ناکەنن..
کە شەو داهات
چرایەك بۆ هیواکانم
هەڵدەکەم
گۆرانیەکی نامۆ
بۆ ئازارەکانی ئەم شەوە
دەچڕم..
دێم دەستی زەردی خەیاڵ دەگرم
بۆ نێو بەهارێکی دیکەی دەبەم
وەلێ چەند ئەستەمە

لەم شەوەدا
لەنێو سۆزی پێکەکاندا
دەست لە بەرۆکی گریان هەڵگرم
بۆنی پرچی گوڵێک بکەم
تەمەنم نوژەن بێتەوە..
دەلال .. خۆ من پیرە دارێکی
پایز نەبووم
بە سمکی ترپەی لەنجەکەت
بیرەوەرییەکی تاڵم لیٚ هەڵکەنی..
ئەی نازانی
لە پایزە عومرێکی تر ..دەوەریٚ!
دڵیش ژوانێکی دیکەی .. دەویٚ..

# لافاوی ناز..!

چەپکێ خەمی

ئەم زەمەنە

وەکو کەزی.. دەهۆنمەوە

لە سەر سیمای.. حەزەکانم

تاکات.. تاسات

هەروا بڕوا

خەم دەبێتە

دەسگیرانم..!

* * * *

لە سەر ڕێگای

کاروانی خەم

ئەمجارەیان.

هەنگاو ..هەنگاو

پەنگی گڕی هەناسەی خۆم

دەخۆمەوە..

لە قولایی بیرەوەریم

ڕێ وون دەکەم

بۆیە جار..جار

بە هەناسەیەکی ساردو سڕ

دڵی ماندووم

دەدەمەوە

*　　*　　*　　*

هۆ کچۆڵەی شاخی کوێستانی

بەرگرمۆڵەی هەوری شەرم

ئەفسوونی چاوت

وەک لێزمەی بارانی عیشقە

سروشت سازە

لەشم مۆتەکێکی ساردو سڕە

نقومی لافاوی نازە ..!

# مەراسیمی ...زامەکان..!

لێرە نەبووی
کاتێ گریان
سەردولکەی مەرگی
دەهۆنیەوە..
خوێن لیتاوی
لە قۆڵ و باسك هەڵکردبوو..
لەکوێ بووی
بۆ سارێژی ئەو برینەی
بە باڵای دایک و کۆرپەکەی
دەتکایەوە..
لێرە نەبووی
لای لایەیێ
بۆ منالێکی نێو بێشکەی جێماو
بچڕی..
لە کوێ بووی
لەمەراسیمی ئەنفال و
شیوەنی.. هەڵەبجەی شەهید
لەناشتنی تەرمی

ئەم هەڵۆیانەی
کۆڵمەی خاکیان
بەحەلاڵی ماچ کرد
تۆ لە نێو بەزمەو
بادەی حەزی غەریبی دا
جار .. جار
ئەگەر دەردی دووری
هەراسانی دەروونی دەکردی
لە دوایی دا
لەنێو سینەو
تێکەڵ بوونی جەستەی
کچێکی نامۆدا.. دەتشاردەوە..!

# نیشتیمان .. یا ڕووت بوونەوەی هەگبەیەک

( بۆ ئەو شاعیرەی نیشتیمانی لەباوەشی ژنێك دا گۆڕیەوە..)

کاتێ فارِغۆنی
تەمەن جێ ی هێشتی
هەگبەی شیعرت
بەتاڵ بوو...!
جاران ئەم وشانەی
لەکۆپلە شیعرێك
داد دەرِشت..
ماچی گوڵیان
بەخاك دەسپارد
بە وورشەی سەردولکەی بایەك
دەست لەملانێی
پایزە شێتە دەبوون..
لەگەڵ سۆزی دارەکان دەگریان..
دەرِژانە سەر
دەمی قڵیشاوی خاكو
سیمای پاکی نازدارێك
کەچی ئێستا

وەك ئافرەتێکی داوێن پیس
ڕووت بوینەوە..
لەکۆڵانەکانی خەزانێك
بەدوای حەیادا دەگەڕێن..
کەس دەرگایان
لێ ناکاتەوە..!
جاران شیعرەکانت
سەرە ڕەمی گشت خەونێکی
نیشتیمان بوون
ئەم خەونانەی
لە درزی پەنجەرەیەکەوە
تیشکی خۆریان
ماچ دەکرد..
بەڵام ئێستا
نیشتیمانیان بە یەك ماچ
گۆڕیەوە..!

# شاعیرێکی سەرخۆش

کە بادە..
ووشەکانی سەرخۆش کردی..
ئەم کۆپلانە
هەڵقولاوی هەگبەیەکی
بێ ئاگایە..
من ژنی ڕووتم زۆر دیوە
بەڵام بە هەستی سەر خۆشێک
بە باڵای ژنم
هەڵنەچنیوە..
بە سەر خۆشی
سەیری تەنورەکەی
ئەم ژنەش ناکەم
کە با هەڵی دەداتەوە..
سوکایەتی بە باڵای
درەختی هیچ پایزێک ناکەم
چاوەڕوانی ئەم خەزانەم
بەجوانی خاکدا بنازێ
نا بە هەگبەی شاعیرێکی
بێ ئاگای.. سەرخۆش !

# لە ژێر شەپۆلەکانی خۆردا

ماوەیەکە
لەم وڵاتە خۆر هەڵنایێ..
پرچی گەشی
بەسەر خاکدا شانە ناکا..

**( زانایانی فەلەك )**

مشتو مڕیان بوو
بێ خۆر چی بکەن
چۆن بتوانن
ڕووناکیەك دروست بکەن
هاوتەریبی ڕۆژانی ڕۆتین بێ

**( خـــاك )**

شاخ.. دۆڵ.. دەشت
دڵی یەکتریان دەدایەوە
کڕنۆشیان بۆ یەکتر دەبرد
ئاوێتەی ڕەنگی زەردی
یەکتر دەبوون..

**( گۆڕستان )**

مردووەکان

تێکڕا هەڵسابوونەوە سەرپێ

بەخێر هاتنی

میوانەکانیان دەکرد..!

**( ئەستێرە )**

تریسکەی .خۆشیان

دەڕشتە سەرسیمای خاکو

بە ڕووی یەکتر

پێدەکەنین...

**( مانگ )**

بە تریفەی خۆی دەنازی

بە ئەستێرەکانی دەگوت

وەرن پرچم شانەکەن

من لەهەمووتان.. جوانترم..!

**( درەخت )**

گەڵاکانی بۆ شەپۆلی

ئەم تیشکە دەگریان



کە هەموو ڕۆژ
ئاسۆیان بەجوانی خاك
شاد دەکرد..

**( بانگەواز )**

کاتێ زانایانی فەلەك
بڕیاری ئەوەیان دەکرد
جەنابی خۆر.. بەڕێوەیە
هەمووشتێ.. شاگەشکە بوو..!

**( ئاگاداری )**

لەگەڵ هەڵاتنی خۆر
خاك بەجوانی
هەموو شتێ شادبوو
وەرە گوڵم..
بامن و تۆش
لە ژێر شەپۆڵەکانی خۆردا
بەئامێزی .. یەکتر شادبین..!

# گەر پیریش بم

ئەو دەمەی
کە لێک دابڕاین
لەبیرتە پایز
کراسێکی زەردی لەبەربوو
باڵندەکان بارگەی کۆچیان
تێک نا..
من بۆ چۆلەکەیەک دەگریام
کە هێلانەی لەنێو دڵم
چێ کردبوو..
تۆش لەنێو گەڵا وەریوەکان
ئەشکی جودابیت .. هەڵدەڕشت
بارگەیەکی نامۆت .. تێک نا
سەرت هەڵگرت..
ساڵ هاتو ڕۆیشت
باڵندەکان گەڕانەوە. .
گەڵا بەرگی سەوزی پۆشی
هۆگوڵە خان..
هەرنەهاتی لەم عەشقە وێڵەم

بپرسی.. ئێستا لەکوێی؟
چاوەڕوانم تا ئەوساتەی
گەر پیریش بم.. تابمێنم
بەتەزبیحەکەی دەستم
دەستەو گۆچان..
چەندەها پایز دەژمێرم..
تا دێیتەوە..!

# هەگبە دۆڕاوەکانی .. تەمەن ..!

وەرە.. دەلال
با ئەم دەڤەرە جێ بێڵین
باچیتر بەدوای
هەگبە دۆڕاوەکانی
تەمەن.. نەکەوین
با لەنێو جەستە ڕووتەکانی
پاییزی قوبادیش
خۆمان گەرم نەکەینەوە..
لەگەڵ کۆپڵە
بەگرەکانی پەشێویش
تف لەخۆمان نەکەین
باچیتر بۆ داستانە
پڕ لە ئەفسانەکانی
بێ کەسیش ..نەگرین..!
دەستە بە قرێژەکانی خەباتیش
بەرووی یەکتر.. نەسڕینەوە
وەرە.. با گەردن ئازادی لێک بکەین
پرێسکەیەک .. لە یادگاری

ماڵۆچکەیەک.. پڕ لەئەوین

بەکۆڵ دادەین..

با ئەم دەڤەرە .. جێ بێڵین

با ساتێکیش لەگەڵ ئەزەل

بدوێین..

سڵاوێک لە نەورەسەکانی

کەناری دەریای شەرم.. بکەین..!

ڕێچکۆڵەیەک بۆ دەروازەی

فیردەوس بچنین...

بە شەپۆڵی ئازارەکان

گوناهەکانمان.. بشۆینەوە..!

# لەژێر ڕەنگەکانی ئاسماندا

ئێوارەیەو
خڵك لە دەروازەی
ڕووناکی خۆر دەپارێتەوە..
ئالاّ بەڕووی ئاسمانێکی
نارنجیەوە پێدەکەنێ
خەیال بۆ تەلیسمی
حەسرەتەکانی جامێ بادە
دەگری..!
فرمێسکە قەتیس ماوەکان
سیمای شۆڕبـیەکم
لێڵ دەکەن..
هەنگاوەکانم مەست دەبن
لە سەر ڕێگای شۆستەیەکی
کپو هێمن
چراکان زۆر بەکزی، دەسوتێن
نەرمەبایەك
ڕێچکۆڵەی گریانم
دەشێوێنێ..
چیتر بۆ بەهارێکی
دۆڕاو.. فرمێسك نارێژم

هەناسەکان
تێکەڵ.. شەماڵی ئاسمانێکی
پەمەیی ناکەم..
بە دیار خەونێکی ئەرخەوانیەوە
بۆ هیچ هیوایەك ناگریم..
وەرە.. هەر چەند دەکەم..
تۆ.. بەڵکو خۆمیش
لەبیر خۆم ببەمەوە..
پێش ئەوەی بەرشانەوەیەکی سەلەفی
سیمای ئەم خاکە پیس بێ..
ئەم ئێوارەیە .. لەژێر ساباتی دارەکاندا
گەلاً زەردەکانیش .. بەم مەهزەلەیە
پێدە دەکەنن..
منیش بەدوای .. کۆتایی خەمەکاندا
وێڵم ...
بۆ ئەم جەستانەی
لە ژێر ئالآیەکی ..کاڵ
وەکو مۆمێك .. کز دەسوتێن..
بۆ دۆسیەی عەشقێك
ساڵەهایە...
یاری بە دروشمی نیشتیمانم.. دەکا..!
نیشتیمانێکی پڕ لە ماچو

پڕ لە شەهید..
پڕ لە سەوزو سوورو .. پەلکە زێڕینە..
وەلێ ئاخ.. چەند ئەستەمە
کەشەو داهات
ئەم ئازارە.. پڕ گڵکۆیە
ئەم ئاواتە ڕۆمانسیە
لەباوەشی ژنێک هەڵرێژم
خۆم تەسلیمی قەدەرکەم..
فرمێسکە بێ نازەکانم بسڕنەوە
بەم هەنسکە ماندوانەم
بڵێم ئۆخەی ..!
سەر بە سینەیەک بکەم
چیتر خەون بە ڕەنگەکانی
ئاسمانەوە.. نەبینم..
هەر لەم شەوە
دەستی لەرزۆکم .. مەست دەبن
بۆ ئاوێتەی ئەم ڕۆحانەی
کە لە هەردوو دنیا
مەحرومن..!

# ئەو خەمانەی بۆ باوەشت.. دەپەڕنەوە

دوور مەکەوە.. لەم پەیڤانەی
کە لە ئێوارەیەکی نارنجیدا
لەکەناری دەریای شەرم
دەڕژێنە نێو دەمی قڵیشاوی
سۆزێکی بێ ئۆقرە..
نائازیز بەلوغزی
پیتەکانی (نا)
مەمخەرە ژێر
چارەنوسێکی نادیارو
لەم بەهارە
وەك پەپوولەیەکی شەکەت
بێ باڵ لەژێر
گەڵاکانی ئارەزوودا
پەڵکێش نەبم
باچیتر خەون
بەتریفەی مانگ نەبینمو
لەتریسکەی ئەستێرەکان
زوویر نەبم..
با لە ژێر پەردەی ئازارەکانی

شەوێکی نامۆدا
ئاشنابم..
لەگەڵ بوونی خۆمو
لەزەتی ئەو ماچانەی
کە دەرژێنە نێو سینەی
شاژنێکی ئیمپراتۆری
سەردەمی ئەم عشەقەی من..
وەرە نزیك بەوە لێم
دەستی ئەو خەمە کوێرانەم بگرە
کە لە شۆستەیەکی کپ دا
لە شەوێکی ئەنگوستەچاو
بۆ باوەشی نەرمت دەپەڕنەوە..
وەرە خەمە تاراوگەکانم
بەم ماچە شیرینانە شادکە..
شیرینتر لەشیلەی هەنگوینو
لێوی ووشکم سوور ببنەوە
سوورتر لە سوراوەکەی
سەر لێوت..
تاکەی . لەمن دەبیە مۆمیایەکو
هەر بەدواتدا بگەڕێمو
هەرجارەی لەئاسمانی
خەیاڵێکدا بتدۆزمەوە..!

# پاسەپۆرتی ڕاز..!

ئەمشەو ڕاز.
وەک ئەستێرە دەرژێتە نێو
قەدپاڵی ئەم شەوە تاریکانەی
کە مەرامێکی پڕ تامەزرۆ
خۆی لێ حەشارداوە
تارمایی چاو
کوێرە لە ڕاست ئەم ئازارانەی
چەندەها ساڵە
یاری بە ڕووناکی خۆر دەکات
تریفەی مانگ بەسیمای زەردی
ئەم ئێوارەیە پێ دەکەنێ
بەڵێنیش بەشەوە زەنگێکی کپ دەدا
کە لە ژوانێکی پڕ حەسرەت دا
پەیامی پڕ خۆشەویستی
بەسەر دوو دڵ پەخش بکا
کەلە نێو سینەیەکی پڕ تامەزرۆ
حەزە تینوەکانی لێ دەبریسکێتەوە..
ئا لەم ساتە پەنجە سیسەکانم
لەسەر سینەی تۆ دەسرەوێ.
حەیرانێک بۆ دڵ
سە ردولکەیەک بۆ شەو

**دروشمی ئەوینێکی پاک**
**بەئاسمانی شارێکی خامۆشدا**
**هەڵدەواسرێ..**
**لەژێر شەپۆلەکانی**
**سیمای دووجەستەی نامۆدا**
**نەورەسەکانی حەز**
**بۆ ئەم دەڤەرە پڕ ئەوینە**
**کۆچ دەکەن**
**لە ژێر بنمیچی ئەم عەشقەی نێوانمان**
**هێلانەی خۆشی چێ دەکەن..!**
**نا ئازیز نەکەی**
**پەی بەم هەڵوێستانەم نەبەی**
**کە ماوەیەکە وەک ملوانکە**
**ڕیزم کردووە بۆ گەردنت..**
**گلەیی لەو ماچانەم نەکەی**
**کە مۆرکی حەزێکی پڕ حەسرەت**
**لە سەر سینەت دەپرژێنێ**
**هاتووم لەنیشتیمانی دڵت نیشتەجی بم**
**تەنها جارێک فیزەی ئەوەم پێ بدە**
**دەستی لەرزۆکم**
**لە سنووری دوگمەکانت بپەڕنەوە**
**ئەو سالەم ژوانە بێ ئۆقرەیە**
**پاسەپۆرتی ڕاز**
**لەسۆمای چاوەکانت.. وەردەگرم..!**

## نامەیەک لەقەرەچوغەوە..!

شار هێشوویەکی کپ
لەگەرووی شەوەزەنگێکی
پڕ ژان دەئاڵێنێ.
شەوێک لەبێدەنگی خۆی بێزارە..
منیش هەگبەی شیعرم
لەپرێسکەی قەرەجێکی
نامۆ دەچێ..
لەشۆستەکانی ئەم شارە
وەک سواڵکەرێک
لەبەردەمی کڵێسەکان
کۆمەڵێک پەیڤیان ڕاخستووە
ئەی شارەکەم .. بیرت دەکەم
ئەمشەو خەونم پێتەوە دی
لەخەوما قەلآ
بەرگی ڕەشی پۆشیبوو
منارە تادەهات
لەباوەشی خەمدا دادەڕما
لەبیرمە جاران

کە سەفین دەگریا
قەرەچوغ دڵی دەدایەوە
لەگەڵ قاسپەی ئەم کەوانەی
دەبوون بە سیمفۆنیای ئاشتی
تەرمی ئەم هەڵۆیانەی
کە لە چیا.. دەشت .. دۆڵ
هەرگیز کۆڵیان نەدەدا
کەچی ئەمشەو
قەرەچوغیش دەگری..!
فرمێسکەکان لە قەدپاڵی
زوورگەکانی مەتەڵی شەڕ
ڕێچکۆڵەیان بەستووە
وەکو باران دەڕژێنە نێو
شەقامەکانی شارو
لەدەرگای گشت ماڵێك دەدەن
پڕ بەحەسرەت
نێوچەوانی قەلا ماچ دەکەن
دەست لەملی
ئەو منارە لارە دەکەن
کە زەمانێکە ناتوانێ

سەر بۆ شەپۆڵی خۆر

بەرزکا..!

باڵای لە پەلکەزێڕینە بئاڵێنێ

تامەزرۆیە بۆ ئەم ساتەی

لە ئاسمانی شارێکی خامۆشدا

پرچی خۆر شانە بکا..

ئەو نامەیەی

لە قەرەچوغەوە بۆی هاتووە

بۆ ئەم دوو دڵە پۆست بکا

کە ساڵەهایە بەیەك ناگەن..!

# پەیامێک لەقەڵاوە..!

دەنگێ لە ترۆپکی
قەڵاوە دێ...
دەچێتە باوەشی پەلە هەورێک‌و
لەگەڵ شەماڵ
پەیامێک لە سەفین وەردەگرێ
بۆ بادینان.. بۆ گەرمیان
بۆ کەرکوکی خۆری کوردستانم
هەنگاو دەنێ..
ناڵەی ئەنفال‌و
هاواری هەڵەبجەو
ئاهو نوزەی مناڵێکی
بێ باوکی پێ یە. ناسرەوێ
وەکو باران دەرژێتە نێو
دەمی قڵیشاوی خاک‌و
وەک نەمامێک لەسەر گۆڕی
شەهیدانمان دەڕوێ..!

# بوکی دەریا..!



لە بوکی ناکاو خزایتە نێو
ونەوزە پڕ حەسرەتەکانی
چوار چێوەی هەست
بەچاوتروکانێکیش
لێ ی دەرچووی..
دەلال .. هێشتا زوو بوو
مابو بگەیتە ئارەزووەکانی مەبەست
پەلی هەستم لەسیمای
ژاکاوت بئاڵێنم..
نوێژی ئەوین بۆ پەیامە
هەڵچووەکانی قیبلەی دڵداریمان
بکەین..!
لە ژێر ئاوازی ئاوێتە بووندا
سەما بۆ هەنسکە
ماندووەکانمان بکەین..
ئێستا لە کوێ ی؟
بست بەبستی ئەم دەڤەرە
بەدوات گەڕام
لە هیچ شوێنی... نەمدۆزیەوە
لەم ئێوارە خامۆشەدا

لەکەناری دەریایەکی
بێ سەروشوێن
کەتازە ماڵ ئاوایی
لەشەپۆلی خۆر کردووە
دوا هەنسکی. حەسانەوەمە
دەریا..
توخوا ئەگەر هەواڵت پێ یە
پێم بڵێ
ئەم دەلالەی
لانەی لەنێو دڵم چێ کردووە
لای تۆ نی یە.؟
توخوا ئەگەر لەناخی خۆت
حەشارداوە..
مەیەڵە جانەوەرەکان
ئازاری دەن..
هێدی .. هێدی
بەشەپۆڵە هێمنەکانت
پرچی ژاکاوی شانەکە..
لێ گەڕێ با
ئەم بووکەی من
بۆ خۆی بنوێ..!

# زەماوەندە ئاڵتوونیەکان

سەرابی ئەم ئێوارەیە
چەند ژانێکی ئەبەدی یە
بەتاریکی زەماوندە
ئاڵتوونیەکانەوە پێدەکەنێ
چ زریانێکی ئاستەنگە
لەسەر ڕێگای ئەم کاروانەی
کە نەمامی چارەنوسم هەڵدەکەنێ..
ئاخ بۆ ئەم مەیلانەی
کە لەسەرە مەرگێکی ئەفسوناویەوە
ئاوس دەبن..
بۆ مەزگیرانی ئەم دەروونەی
کە لە قەیرە ژنێک دەچن..
چەند غەریبن
ئەم خەمانەی کە لەم شەوەناموٚیەدا
لە دایک دەبن..
کەچی هێشتا کۆشکی سوڵتانەکان
بەئاڵتون ڕازاوەتەوە
گۆشەی دیوەخانەکاینان

بە مرواری چنراوەتەوە..
منالآنی ئەم دیوی کۆچیش
بۆ ژەمێ نان
دوور لەسۆزی باوکیان
دەگرین..
هەمووساتێ بۆکاروانی
ئەم سەفەرەی
کەچیتر ناگەڕێتەوە
فرمێسکی چاوانیان دەسڕین
ئای لەم خەنەبەندانەی
کە سیمفۆنیای مەرگ دەژەنێ
نە ئازادی پرچی خۆر
شانە دەکا..
نە ئەستێرەش بەڕووی خاکا
پێدەکەنێ..
لە بێدەنگی
خەڵکی ئەم دەڤەرە وێرانە
لە ئاوێزانی
ئەم دوو دڵە پڕژانە
ئاخۆ سبەی چ ئاسمانێک

بارانی پڕ نەهامەتی
بەسەر شارا دەبارێنێ
ڕەشەبای شووم
پەڕەی کام گوڵ
دەوەرێنێ..
چییە گوناهی ئەم شاعیرەی
کە تادوێنێ
بەدەستی لەرزۆکی
پرچی خاوتی
شانە دەکرد..
ماچی بۆ پەرژینەکانی
خاك دەپرژاند
کڕنۆشی بۆ جوانیت دەبرد
نا.. گوڵەکەم ..نا
ئەمجارەیان
یا لەباوەشی یەکتر دەمرین
یاخود دیسان
پشت لەخۆری ئەوین دەکەین
سروودێك بۆ مەرگ دەچڕین..
ئەم خەمانەش

هەردووبارە دەبنەوە

کە ئێوارانێ تا بەیانی

دەست لەملانێی

گەردنی زیوینت دەبن

قەتارەی حەز دەهۆننەوە

شەوان لە زەماوەندو

بۆ ساتێکیش لەباوەشت

دەمێننەوە..

کەچی هێشتا ئەوان

خەویان لێ نەزڕیوە

حەیرانی شەو

لەپێڵوی چاوەکانیان

نەبەزیوە..

لەم دیوی پەردەی شەرمەزاریەوە

شەڕابی مەرگ دەنۆشن

چاو لەزامی ئازارەکانمان

دەپۆشن..

بەڵێ گوڵم ئەم زامانە

بەتارمایی تەمەنی ژینمان

پەیوەستن

کەچی هێشتا ئەوان

بەدیار سۆزی

بەیتەکانی خەیامەوە

مەستن..!

کێ پەردەی خەم

لەسەر زامی ئەم دەڤەرە

هەڵداتەوە..

کێ ئاورێ لە ئاپۆری

زەماوەندی مەرگ دەداتەوە..!؟

# پرسەی عەشقێکی نەمر

لێرە لەسەرە مەرگێکی
ئەرخەوانیەوە
رۆح ئاوێزانی
باوەشی دابڕانی ئەوینە
چاوم لێ یە سیما تەڵخەکان
دەستی پاڕانەوە
بۆ ئاسمان هەڵدەبڕن..
دوو دڵۆپ
فرمێسکی قەتیس ماویش
لەگۆشەی چاوەکانی
تۆ دەبینم..
نا.. گوڵە خان.. نا
بۆ یادگاری یەکانی ئەوین
مەگری...
با لە هەگبەی عەشقی ئێمە
بمێننەوە..
لەگەڵ تاڵە قژێکی خاوت
بیخەرە ژێر کفنی ئاڵی

ئازارەکانم..

با شاهێدبێ لە مەحشەری

دابڕانی عەشقی ئێمە

کەتۆش هاتی بەدوای سۆراخی

پرێسکەی ئازارەکانی من

چی ئەشکی جودایی هەیە

لەگەڵ خۆتا بێنە

با ئەفسونی

شەپۆلەکانی جوانیت

نەبێتە نەزەر..!

ژەمی تینووی

ماچە قڵیشاوەکانیش

لە لاپەڕەی گوناهەکان

تۆمار نەکرێن..

تریسکەی ئەستێرەی فیراقیش

بانگێشتەکە.. باگەواهی

بۆ ئەم عەشقە پاکەی

نێوان ئێمە بدا..

کە لە شەوە زەنگێکی کپ دا

بەڵێنمان بەیەکتر دەدا

کەهەرگیز سۆزی عەشق

لەباوەشی یەکتر نەتۆرێنین..!

وەرە با ئاوێزانی ئازارەکانی

پڕ بەزەیی قەدەربین

چیتر سەردولکەی نامۆ

بۆ مەزاری ئازارەکان

مەهۆنەوە..

لەپرسەی لێکدابڕانی

دوو دڵ دا

ئەشکی جودایی.. هەڵمەڕێژە...

نەوەکو گوناهباربی..!

پێت وانەبێ ئیدی تەواو

هەور بەری خۆری ئەوین دەگرێ

چیتر باران

کێڵگەی ئەوینی ئێمە.. ئاونادا

دڵنیابە سەر لەنوێ

لەساڵ وەرزی دابڕانمان

نەمامی عەشقێکی پاك.. دەڕوێ..!

# ناخی شیعر

لەوەتەی چیا دەناسم
هەر بەبەرزیو
جوانی خۆی نازیوە
خۆڕاگرەو
دوژمن بەدیاریەوە
بەزیوە ..
لەوەتەی گڕیش دەناسم
هیچ سڵ ناکاو
نەبەزیوە..
خۆڵەمێشی
هەموو شتێکی نۆشیوە
لە وەتەی شیعریش دەناسم
سۆزی حەزی
لەناخم دا هەڵچنیوە.
سەنگەرە بۆم
سیمای خەمی
داپڵۆسیوە..!

## سەفەرت خێر

سەفەرت خێر
هۆ برادەر
ئەی هەوێنی
زامی سەختی ئەم دەڤەرە
دەزانم ئازارەکانی
ئێرە نەیاندەهێشت
دڵی هەژاری ئێرە
ڕازی کەیت
بە هەڵوێستی ژیرانەی خۆت..
کەچی سەرت هەڵگرت
بۆ وولاتی بێ دەنگ‌و باس
تۆ بەئەمەکترین کەس بویت
تۆ درەختت خۆشدەویست
تۆ سەوزاییت خۆشدەویست
کە پایز دەهات
بۆ گەڵازەردەکان
دەگریای..
تۆ گشت کەسێکت خۆشدەویست
دارو بەردی ئەم وولاتەت
خۆشدەویست

کەچی نەیانهێشت
دەستی شەپۆڵەکانی
خۆر بگریت
بەڕووی ئەم خاکەی
شاد بکەیت..
کە ڕۆیشتی باڵندەکان
لەگەڵ تۆ کۆچیان کرد
دەستی چۆلەکەکانی
ئەوینت گرت
پەیتا .. پەیتا
بۆ غەریبی گوزەرتان کرد
بەڵێ هاوڕێ
سەفەرت خێرو سەلامەت
من دەزانم
لە وورشە وێرانەکانی
با زویر بویت
لە شریخەی هەورە ڕەشەکان
لە شەپۆڵە شێتەکانی دەریا
زوویر بوویت..
کە ڕۆیشتی ماڵ ئاواییت
لە ویژدانی ئەم خاکەکرد
برۆ خوا یاوەرت بێ ..!

# مەراسیمێک بۆ عەشق



ماوەیەکە
سۆزی نۆتەکانی دەنگت
وەک سیمفۆنیا
بەگوێچکەی مندا نازرینگێ
سیمای پڕ وەنەوزەی جوانیت
بە تارمایی چاوانم دا تێناپەڕێ
ئاخ.. ئەگەر دەزانی
بارتەقای چ دەریایەکی
بێ کۆتایی .. یادت دەکەم
ئەوەندە تامەزرۆی بینینتم
وەک دەمی قڵیشاوی خاکێک
بۆ لێزمەی بارانی خۆشەویستی
وەک گەڵای سیسی درەختێک
بۆ شەپۆڵی تیشکی چاوەکانی خۆر..!
لێم مەپرسە
بۆ ئەوەندە هۆگری
خشپەی هەنگاوەکانی تۆم..
لەجێ ژوانی تەنیاییم دا
بۆچنینی ئەوینێکی پڕشەنگداری
شەوەزەنگێکی هێمن..

کە هەر دووکمان لەتکای
ئازارەکانی چاوەڕوانی.. بگەین..!
من بۆ ساتێکی دڵە وێرانەکەی
ژێر ڕەحمی زامەکانی
جوانی تۆ..!
تۆش بۆگڕی
خەمەکانی ئەم شەوە
بێ ئارامە..
کێ لەزمانی ئاخاوتنی
دووهەنسکی پڕ ئەوینی
ئێمە تێ دەگا..
کێ لەگەڵ دەنگی
تاسەی تێکەڵ بوونی
دوو جەستەدا
وەئاگادێ..!؟
تاکات.. تاسات
بەسەربچێ
سەدای دەنگی
عەشقی ئێمە لەم شەوەدا
بێ دەنگ نابێ.. بێ دەنگ نابێ..!

# کەمن دوورم

چەند نامۆیە
ئەو سترانەی لەغەریبی
دەڕژێتە نێو
هەستە تۆراوەکانی زەمەن
وەلیٚ هەرسات
لە ژینی من دەڕوا تەمەن
کە من دووربم
تابلۆی جوانی ئەم دەڤەرە
بەمن چی..
شۆخو شەنگو
ڕوومەت ئاڵی
ئەم دەڤەرە بەمن چی
کە مردیشم
خاکو خۆڵی ئەم دەڤەرە
بەمن چی..
منی سەرقاڵی
دوورە وولات
دوور لەپەیڤی
پڕ تامەزرۆی دڵدارانم
دوور لە ئامێزی
پڕسۆزی نیشتیمانم..!

# ساڵی نوێت پیرۆز

کاتژمێر میلی چرکەی
لەدوانزە تێ پەڕی
لەگەڵ یەکەم ساتی ساڵی نوێدا
ساڵێک لە تەمەنی تۆ دەڕوا
چەندەها ساڵیش
لەعومری من..!
وەلێ چاوەڕوانی
چەند ئازارێکی نامۆیە..
لەتەنیایی‌و بێ تۆیی دا..
چرکە پڕ حەسرەتەکانی ژین
بەبێ ئەوەی
ئاوڕ لە ژەمە تینوەکانی
ئەوینی من بدەنەوە
دێن‌و دەڕۆن
منیش لە چاوەڕوانی دا
هەرساتێکم تەمەنێکە
هەر چرکەیەکیشم ساڵێکە..!
وەرە با ئاسمانێک

لە دەریای خۆشی
چێ بکەین..
بۆ بارانی ئەوینی ئەمساڵمان
گریانێک بۆ خۆشی
ئەشکە بێ ئارامەکانمان
ساز بکەین..!
با برینی زامی سەختی
چاوەڕوانی
لەباوەشمان بتوێتەوە..
تەمەنم نۆژەن بێتەوە
ئەوسا هەرئەوندە
دەمێنێ پێت بڵێم
ئەی هەوێنی زامەکانی
دڵەی پڕسۆز
ساڵی نوێـت پیرۆز...!



# درامای شەوێکی نامۆ

**( خەیاڵ )**

هاوڕێ یەکی بێ ئارامە

لەم شەوە نامۆیەدا

**( شەڕاب )**

شوشەیەکی قنجە

وەك ژیکەڵەیەکی لێو بەخەندە

بە ئازاری حەزەکانم

پێدەکەنێ..

**( زمان )**

لەنگە .. لەبێ هۆشی دەروون و

تاراوگەی خەمە بێ کۆتایی یەکان..

**( دڵ )**

بیابانێکی ووشکە

تامەزرۆیە

بۆ بارانی حەزە ئەرخەوانیەکان..

**( شەو )**

ساتێکی هێمنە

ئاسمانێکی بێ کۆتایی لەئەستێرە

خەوخۆشی

لە هەستە بێ ئاگاکان.. دەکەن.



**( چرا )**

کز.. کز دەسوتێ

لەگەڵ هەنسکی

شاعیرێکی بێ هۆش

ماڵ ئاوایی لە شەو دەکەن..

**( گزنگ )**

دەستی شەپۆڵە شێتەکانی

ئەوین دەگرێ

بەسەر جەستەی ماتو سڕم

گوزەر دەکەن..!

# هەنسکی وێڵ..!

( شیعری گۆرانی)

هەناسەی شیعرێکی تینوو
گڕی خەمێکی تێزاوە
هەر چەند دەکەم
ووشەکانیم
بۆ ناکرێن بەهۆنراوە..!
کەتۆ دووری لەم پەیڤانەی
کەهەگبە بۆی تامەزۆریە
بۆ ماچێکت ڕەنجەڕۆیە
هاتووم تاوێ
لە ڕەشماڵی قژی خاوت
بسێمەوە..
ئەم هۆنراوەی بۆم داناوی
لەنێو تاڵە بسکی تۆدا
بهۆنمەوە..
چی لە شیعرگەورەترە
چی لە پێکی ئەم وشانەم
بێ هۆشترە..
دەیکەمە تارای بوکێنی

ڕووی شەرمنت
دەبنە ڕستە عاشقبەندێک
بۆ گەردنت..!
ئەریٚ گوڵم
چاوەڕوانی ساتێکی
وا پڕ لەخەمە
لە نێو دڵم
وەرە بتکەم بەشاژنی
ئەم شیعرە پڕ لەئازارەم
زەمانێکە ووشەکانی
تامەزرۆیە
لەنێو ئەم دڵە بیٚ چارەم..!
نەتدەزانی
ئەم عەشقەی من ساڵەهایە
دۆسیەی کۆمەڵیٚ ئازارە
دوایی نایە
وەرەگیانە مەلی هەستم
وێڵە بەدوات
بەم پایزە ..
کەچی هێشتا لێوی ووشکم
لە ماچێکی لێوت زیزە

خەمی دووری و
بێ ووچانی ئەم شەوە
بێ ئارامە
سیمفۆنیایەکی نامۆیە
بۆ ڕەوێنی ئەم ئەشکانەی
کە بەدوای تۆ ڕەنجەڕۆیە
ئەی جوانترین تابلۆی خەیاڵی من
سۆزی عەشقت وەك پەپوولە
دەفڕێ لەنێو گوڵزاری من
لەبیرتە ئەم ساتانەی پێت دەوتم
خۆشم دەوێی..
من بەبێ تۆ ئۆقرە ناگرم
بۆیە منیش بەدوات وێڵم
هەنگاوی شێتانە دەبڕم
نا ئازیز.. نا
ئۆخەی بۆ ئەم حەسرەتانەی
کە باوەشیان بۆ خەمەکان
دەکەنەوە..
بۆ هەنسکی ئەم پێکانەی
کەتۆم لەبیرنابەنەوە
من لەگەڵتام لەخەیاڵدا

لەم خەونانەی
دەبنە هەوێنی جوانی تۆ
دەبنە مۆمێك
لە ڕووخساری شەوی یەڵدا..!
هێشتا زوو بوو
کەچی بارگەی کۆچت پێچایەوە
جێ هەورات
لە دەشتی سۆزی دڵ نایەوە..
هێندە گریام
لەشوێن حەزی یادەکانت
بوونە گڵکۆی پڕ تامەزۆری
کێڵگەکانت
ئەمساڵ باخچەی هیوام
پڕ بوو لەگوڵی یادگاری
کەچی دڵم دانەمرکا
لەتاو برینو ئازاری..
بگەڕێوە چ دڵێکی ڕەقت هەیە
هەوارت چۆڵە ئەزیزم
کوڵمەی تەڕت ئاشت بێتەوە
بە وشکایی لێوی زیزم..!

# ئەلبومی تەمەن



سیمای تەڵخی ئەم ئێوارە
چەند ساتێکی
پڕ ئازارە..
چ کابوسێکی نەگبەتە
لەم شەوە پڕ نەهامەتە
ئاسمان جڵەوی
لەکەمەری خاك بەستووە
زریان فرمێسکی
ڕقی ڕشتووە
هێندە پڕم لەگێژە لۆکەی
دەریا قوڵەکانی زەمەن
ئەوەندەش بێزارم
لە ئاسمانە سوورەکانی تەمەن
چەند درەنگە
لەڕابوونی تریفەی مانگی
ئەم شەوە
لە وون بوونی
هەنسکی وێڵی ئەم خەوە

لە زەردەخەنەی
تریسکەی ئەستێرەکان
لەبێدەنگی
هەنسکی دڵدارەکان
لەم ساتەوەختە
لە پێدەشتی
ئەم دەڤەرە چۆڵەدا
لەنێو خشپەی گەڵا وەریوەکان
لەنێو زامی سەختی ئازارەکان
سیمای زەردی
ئەلبومێکی تری یادگاری
بەگڵ دەسپێرم..!
پەیامێک بۆخاک دەنێرم
درەختێک خۆی دەخیلی
پایزە شێتە دەکا..
سەردولکەیەکی نامۆش
لەهەگبەی من سەر دەردەکا
ماڵ ئاوایی
لە ساڵێکی تری تەمەن دەکا..!

# ژیلەمۆی شانۆگەریەکی نامۆ

ئاسمان گرەوی
لە خاك بردەوە
گریان شەڕابی مردنی نۆشی
زریان خۆڵەمێشەکەی
بۆ وولاٌتێکی کەس نەناس برد
هیوا پیتەکانی بوونە قوربانی
دەریایەکی بێ سنوور
مەرگ سروودێکی چڕی..
شەویش سیمفۆنیای
بۆ ژەنی..
ژنێك سەراو ژێر
فەلاقە کرابوو
گوناهەکان.. یەکە یەکە
لەباوەشی دەترازان
چاو هێندەی نەمابوو
ئەفسوونی خۆی
وون بکا..
ڕۆح بەترسەوە
کڕنۆشی بۆ ڕاستیەکان دەبرد



زەمانێک بوو.. شمشێر بازووی
مەتەڵی شەق دەکرد
لەژێر شریخەی
لەشکرەکەی مەهدی
سەڵیبەکان دەڕژانە نێو
دۆڵە سوورەکانی زەمەن..
جەستە مات‌و سڕەکان
خۆیان ئامادە دەکرد
بۆ ئەزموونی کۆتایی ژین.
دۆزەخ هەڕەشەی
لە نەورەسەکانی
کەناری فیردەوس دەکرد
قەدەر چاوی بڕیبووە
شانۆگەریەکی نامۆ
بەزەیی باوەشی
بۆ تەمەنە ختکاوەکان کردبۆوە..
دەستە سووتاوەکانی هەڵەبجە
ژیلەمۆی ڕۆحی ئەنفال
گوڵاڵە سورەکانی خوێنی شەهید
پەنجەی تاوانیان
بۆ جەلادەکان .. درێژدەکرد..!

# بۆ خاوەنی زامەکان

کاتێ پۆستاڵ ڕەشەکان
جەستەی کچێکی ئەنفالیان
ڕیسوا کرد..
تۆش لە دوورەوە
دوو دڵۆپ فرمێسکی قەتیس ماو
هەنسکی پێکێکی برسی
گشت جەستەیان وروژاندی
کاتێ مژدەی گوڵاڵە سوورەکانی
خوێنی شەهیدێک
ئاسمانێکیان لەخوێن چنی
دەریایەکیش لەگوڵاو
تێر.. تێر بۆنی کاسیان کردی
کاتێ گوندیان وێران کردی
بۆ کاریتە شکاوەکانی
بنمیچی ژوورەکەت دەگریای..!
کاتێ سەردولکەی هەڵەبجە
ژیلەمۆی پێنج هەزار رۆح

دەستیان لەمل کردی

تۆش لە وڵاتێکی نامۆدا

لەکونجێکی ژوورەکەتدا

شەڕابی ئەم زامانەت نۆشی

پەیتا.. پەیتا

بێ هۆش کەوتی..!

## هاتووم.. ناگەڕێمەوە

وەرە با سەفەرێك
بۆ دەڤەری زامەکانی عەشق بکەین
بۆ ڕامالینی خەونە جەنجالیەکان
بۆ ئاشنابوون بەڕۆحە مەستەکانی
ئێوارەیەکی نارنجی
بەیەکەوە لەکەناری
دەریایەکی بێ کۆتایی ڕامێنین..
لەگەڵ ئەفسوونی شەپۆڵەکان بدوێین
تائەو ساتەی گێژەڵوکەی ئەوین
لولمان دەدا...
دەچینە نێو حەسرەتەکانی
قولایی زەمەن
دەست لەملی پەیامی واقیعە کانی
قەدەر دەکەین
لەکۆتایی لەگەڵ شەپۆڵە هێمنەکان
لەباوەشی یەکتریدا
دەبینە میوانی نەورەسەکانی
کەناری عەشق

لەوێ تاوێک
تێکەڵ لافاوی حەزەکانمان دەبین
هێدی.. هێدی
لەگەڵ وورشەی شەپۆلەکانی
کەناری دەریا
شنەبای ئەوین
خۆی لەجەستەمان دەئاڵێنێ
لەگەڵ هەر چرپەی ماچێکا
بەڵێن تازە دەکەینەوە
ماڵئاوایی لە ساتە
تەنیایی یەکان دەکەین..!
تاکەی هۆگری ڕێچکۆڵەی
فرمێسکەکانمان بین..
وەرە پەرچەمی ژاکاوت
لە ڕووی زەردم بئاڵێنە
بادوا هەناسەی ئەوین هەڵمژم
هاتووم خەمەکانم
لە ژێر ڕەشماڵی خۆشەویستی
لەکەناری ئەم دەریایە بنێژم
من لەمەملەکەتێکی خەزان وەریودا هاتووم

لەپیتە شەرمنەكانی
نێو هەگبەی ئەوین هەڵاتووم
ئاوارەی نیشتمانێكم
تازە ناگەڕێمەوە
چیدی تێكەڵ سۆزی نۆتەكانی
سروودێكی بێ بەزەیی نابم
لە وێستگەی چاوەڕوانیدا
شەونخونی بەدیار
زامەكانی عەشق دەكەم
هاتووم.. ناگەڕێمەوە
تا فیزەی ئەوین
لەسۆمای چاوەكانت وەرنەگرم..!

# ئەفسوونی ژن..!

ئەوەندە سەرگەرِدان نەبای
لەناوگێژاوی نازە سیحراویەکەی ژن. .
ئەوەندەش لەنیو کۆتی
فرمێسکە مرواریەکەی بەند نەبای
لەبەردەم بڵێسەی جوانی ژن
تەتوابایەوە..
ژنت دەکرد بەکۆیلەیەك
هەموو رۆژێ بۆ مەرامە خۆویستەکان
زینت دەکرد..
لە شەوە پرِ مەستەکانیش
دەتکردە شووشە شەرِابێك
بۆ هەنسکی پێکە سێکسی یەکان..
لەگۆشەی دیوەخانەکانو
لە پیاو سالاریدا
ئەوەندە دەسەڵاتداری..
کەچی بەتاکە ئەفسوونی ژنێك
د ە رِ و خ ێ ی

# مەزاری شەوی شاعیرێک

جارێ زووە
هێشتا ئاسمان
لە تریسکەی ئەستێرەکان نەتۆراوە
خەولەچاوی باڵندەکان نەزڕاوە
وەرە.. بازامی سەختی چاوەڕوانی
لە نێو بەرۆکی تۆ سارێژکەم
لەنێو تاڵە بەندی قژی خاوت
جوڵانەیێ بۆ خەمەکانم ساز بکەم
لە ئازارەکانی عەشق بترازێین
تاوێک لەنێو
ساتەکانی تێکەڵ بووندا بدوێین...
لەسەر ڕێگای کاروانی خەم
هەنگاو نەبرین..
چیتر بۆ حەیرانی
شەوە پڕ حەسرەتەکان نەگرین
لەبیرتە ئەو شاعیرەی ووشەکانی
لە پێناو عشەقی تۆ سەربڕی
پیتەکانی بوونە چەند نۆتەیەکی نامۆ

گۆرانیەکیان بۆ مەرگ چڕی
تۆ بڵێی شێت نەبووبێ
خۆی لەنزاکانی ئەزەل بتۆرێنێ
حەزو خۆزگەی
لە دڵی تۆ بڕەنجێنێ..
دڵتەنگ مەبە لەشاعیرێ
کۆمەڵێ وشەی سەربڕاو هەڵڕێژێ
ئەمشەو هاتووە
لە باوەشی گەرمی تۆدا بیانێژێ..!

# وون بوون

کچێ جوانێ

بەقەد دەشتی سۆزی دڵم

خۆشم ویستی

وام دەزانی پڕ مەبەستی

وردە وونەوزی پڕ جوانیت

لەگوێی شیعرم دەیانچرپاند..

حەزی تینووی

هەزرەکاریمیان دەسووتاند

بۆیە منیش

درووشمی جوانی تۆم پێ بوو

بەرەو قەڵای جوانیت کشام

کەچی گیانە

لە زێباری دڵتا ختکام..!

## لەژێر سێبەری دارخورمایەک

لێم مەپرسە
من لەکوێوە هاتووم
لەپرێسکەی سەرکۆڵی من
ڕامەمێنە..
کۆڵیٚ وشەی زامداری تیایە
هاتووم پیٚ بنێمە
سەرگڵە خوێواوکەکانی ئێرە
سەری قاڵم
بۆ ئازارە سەلەفیەکانی
ئێرە دابنوێنم
هاتووم لەم دەڤەرە
نازی نیشتیمانێکی پڕ لە ئەشک
بنێژم..
لێم مەپرسە
خەڵکی وولاٚتی من چۆنن
باسی زیکری ئازارەکانی
ئەوێم بۆمەکە
من لە وولاٚتێکی

کەس نەناسەوە هاتووم
لێم مەپرسە
بۆ ئەوەندە شەکەت و ماندووم
دەزانم .. من خۆم
لە فرمێسکە قەتیس ماوەکانی
چاوە ڕەشەکانی تۆ دەبینم
ئاوارەیی خۆشم
لەسیمای گەشی
بێ تاوانی تۆ دەبینم
بەزەییت بەمن نەیتەوە
من گوڵێکم لەباوەشی نیشتبمانێک
جێ هێشتووە
حەیف .. کە نەمتوانی
لەگەڵ سۆزی هەناسەیەک
پڕ بە سیەکانم بۆنی کەم..
من لە بێ دەنگی
دەروونە بێ ئاگاکانی
ئەوێ هەڵاتووم
هاتووم تاوێ لەژێر سێبەری
دارخورمایەک بسێمەوە..!

## سوپاسنامە

سوپاسێکی بێ پایان بۆ سەندیکای خاوەن پیشە تەندروستییەکان کەدەستی حەزەکانی شیعریان گرتم بۆ چاپ کردنی ئەم نامیلکەیە بۆ بەرچاوی خوێنەرانی بەرێز.. دیارە سەندیکا تەنها گرنگی بەکێشەو مافەڕەواکانی کارمەندی تەندروستی نادا بگرە پانتاییەکی گەورەی دروست کردووە بۆ ئەوەی کارمەند بتوانێ لەبواری بەهرەکانیدا بەکۆمەڵ بناسێنێ، ئەمەش جۆرە سەرهەڵدانێکە بۆ ئەوەی هەست بەبوونی خۆی بکا لەبوارە جیاجیا کانی ژیان، لەچینایەتی ڕیزەکانی بواری تەندروستی مافەکان بەبێ جیاوازی لەبەر چاو بگرێ..

لەکۆتایی دنیایەك خۆشەویستی بۆ ئەم سەندیکایە خنیجلانەی کەهەست بەبوونی ئەندامەکانی خۆی دەکاو یارمەتیان دام بۆ چاپ کردنی ئەم نامیلکەیە. سوپاسی زۆریش بۆ سەنتەری رۆشنبیری بەهرەو گۆڤاری (نواڵەی نوێ) بۆ ئەو هاوکارییە ئیعلامییەی بەرامبەر بەچاپ گەیاندنی ئەم کتێبە هەوڵیان بۆ دا.

**شاعیر**

# نواڵەی نوێ

گۆڤارێکی مانگانەی رۆشنبیری گشتی - ئەهلی یە -

**خاوەنی ئیمتیاز : هۆشیار نوری لەك ــ سەرنووسەر : ئـاری ئـاغۆك**


**تا ئێستا وێرای چەندین چالاکی ئەدەبی و رۆشنبیری ئەم کتێبانەشی بەچاپ گەیاندووە:**

| ز | نـــاوی کـــــتێـب | بابـــەت | نووســـــــــەر |
|---|---|---|---|
| ١ | سەفەرە تاڵەکەی منو دوعا شیرینەکانی دایکم | شـــیعر | ئاری ئاغۆك |
| ٢ | گەنج و گرفتە دەروونیەکان | دەروونزانی | یوسف عوسمان حەمەد |
| ٣ | ٧٧٧ مەتەڵی کوردەواری | فۆڵکلۆر | هۆشیار نوری لەك |
| ٤ | چرکەیەك تەمەن | شـــیعر | رێدار کانەبی |
| ٥ | کاتێ شیعر دێتە گۆ | شـــیعر | عەبدال شێخانی |
| ٦ | هەگبەی مێژوو | کتێبی مێژوویی | هۆشیار نوری لەك / شەیدا شێخانی پێداچوونەوەی / ئاری ئاغۆك |
| ٧ | قەسـیدەی چە پکـــە گـــــوڵ ، لەمـــەدحـی خــــواو رەســـــوڵ | شیعری ئایینی | مەلا عومەر مەزلۆوم |
| ٨ | دیــوانی نواڵـــەی نـــوێ | شـــیعر | ( ١٠٦ ) شاعیر |
| ٩ | رەنگاو رەنگ | شیعری منداڵان | منداڵان |
| ١٠ | سەمفۆنیای گریانێکی بێ دەنگ | شـــیعر | ژیان بابەگورگور |
| ١١ | گەنجو گرفتە دەروونیەکان ( چاپی دووەم ) | دەروونزانی | یوسف عوسمان حەمەد |
| ١٢ | هەگبەی زانین بۆ زانستە پێوانەییەکان | زانیـــاری | زانا عەلی محەمەد |
| ١٣ | چاوەرێ .. لە شەوانی فرمێسکی وشەکاندا | شـــیعر | سالار عەبدولرەحمان |
| ١٤ | ماڵئاوا گوڵی خەم | کورتە رۆمان | د. هیمدادی حوسێن |
| ١٥ | ( ٩٥٥ ) مەتەڵی کوردەواری | فۆڵکلـۆر | هۆشیار نوری لەك |
| ١٦ | هۆنراوەکانی ووشیار عەبدوڵلا | هۆنراوە | ووشیار عەبدوڵلا |
| ١٧ | خۆشەویستی کچێك لەزانکۆدا | کورتە رۆمان | شاخەوان عەلی حەمەد |
| ١٨ | بزاڤی تەغریبی | کتـــێب | ئاری ئاغۆك |
| ١٩ | وتە ئەڵماسیەکان | وتـــــە | تەحسین خالید |
| ٢٠ | عەشقی نێوان مامۆستاو کچە قوتابی | کورتە رۆمان | شاخەوان عەلی حەمەد |
| ٢١ | مـــن و تــــۆ | شیعری گۆرانی | ئا/ چرپە خۆشناو |
| ٢٢ | من بەدزی باوکم گەورە بووم | کورتە چیرۆك | یوسف عوسمان حەمەد |
| ٢٣ | خۆشەویستی کچێك لەزانکۆ ( چاپی دووەم ) | کورتە رۆمان | شاخەوان عەلی حەمەد |
| ٢٤ | شاعیرێك خۆشیدەویستی | شـــیعر | ئـاری ئـاغۆك |
| ٢٥ | دەمەوێ زیاتر خۆشم بوێی | شـــیعر | کارزان گەرۆتەیی |

| ز | نــــاوی کـــــتێـب | بابـــەت | نووســــــــەر |
| --- | --- | --- | --- |
| ٢٦ | عەشق و گریان | شـــیعر | غەمگین بۆڵی |
| ٢٧ | تاراوگە | شـــیعر | کەریم سمکۆ |
| ٢٨ | عەشق لەنێوان عەقڵ و ئاییندا | لێکۆڵینەوە | قانع خورشید |
| ٢٩ | دیوانی نواڵەی نوێ ( ١٠٧ ) گوڵە شیعر | شیعر | ( ١٠٧ ) شاعیر |
| ٣٠ | نۆبـــــەرە | زانیاری گستی | نازم ئیسماعیل |
| ٣١ | گەنج و گرفتە دەروونیەکان/ بەرگی دووەم | دەروونزانی | یوسف عوسمان حەمەد |
| ٣٢ | ئەدەبیاتی جیهانی | ژیاننامە | د. کەمال مەعروف |
| ٣٣ | گوڵچنییەکانی هەندەران | یادەوەری | قاسم سابیر |
| ٣٤ | سێبەری یادەکان | شیعر | غازی خەیلانی |
| ٣٥ | بێ تۆ بم | شیعری گۆرانی | خالیسە سابیر |
| ٣٦ | هۆنراوەکانی زیاد ئەسعەد | شیعری لیرکی | عەبدولغەفار عەبدوللا |
| ٣٧ | ئەو کاتەی بێ ئاگا بوون لە عیشقی من | هۆنراوە | کاکە عەلی |
| ٣٨ | ( ١١٧٧ ) مەتەڵی کوردەواری | فۆلکلۆر | هۆشیار نوری لەك |
| ٣٩ | قەفتەك ژکەلە پورێ ئاکرێ | کەلتور | خالد حاجی خدر |
| ٤٠ | پیاسەیەك بەنێو کۆڵانەکانی غەریبی | چامی شیعر | ئاری ئاغۆك |
| ٤١ | لەگۆڕەپانێکی رەش و سپیدا | چامە شیعر | غەمگین بۆڵیژ |
| ٤٢ | هەرزاڵی پڕ لەگوناهی ریشۆلەیەك | هۆنراوە | دارا |
| ٤٣ | پەیوەندی نێوان خۆشەویستی و سێکس | لێکۆڵینەوە | هێرش عەبدولوەهاب حاجی |
| ٤٤ | لە مەرگی کەژاڵ دەگەڕێم | کورتە رۆمان | شاخەوان عەلی حەمەد |
| ٤٥ | رەبیکای خنکاو | رۆمان | رەزیە عەبدول |
| ٤٦ | قالە جناوی | رۆمان | محەمەد کەریم نانەوا |
| ٤٧ | سۆزی ئەڤین | هۆنراوە | هەڤاڵ شێخانی |
| ٤٨ | با وەکو جاران یەکترمان خۆشبوێ | هۆنراوە | میدیا داربەسەری |
| ٤٩ | بیروباوەڕی موسڵمانانە | ئایینی | م. سەید ئەحمەد پێنجوینی |
| ٥٠ | لەژێر شە پۆلەکانی خۆردا | هۆنراوە | سەرهەنگ حەمە ساڵح |

**سەرپەرشتی چاپ/ عەبدولغەفار عەبدوڵلا**

**لەئایندەیەکی نزیك دا بەهاوکاری سەنتەری رۆشنبیری ( بەهرە ) چەندین کتێبی تر دەخەینە نێو کتێبخانەی کوردییەوە**